# ڕێگەکانی وانەوتنەوە وفێربون

د.ئەیوب خەسرەو

## پیشەکی

لەتایبەتمەندیەکانی ئەم چەرخەی ئێستا زۆربونی زانیاری و مەعریفەیە بەشێوەیەك پێشبینی ناکرێت،زانستەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا گەشەیانکردوە

بەتایبەت لەبواری پەروەردەو دەرونزانی دا کە جەخت لە سەر پەرەپێدانی تواناکانی تاك دەکرێتەوە، و لە ڕێگەی سیستەمی فێرکردنەوە گرنگی بەسەرجەم لایەنەکانی جەستەیی و ژیری و فێرکردن و کۆمەلایەتی و ویژدانی تاك دەدرێت.

لەگەڵ فراوان بونی زانیاریەکان، ئەو لێهاتوی و کەرەستانە زۆربون کەدەبێت مامۆستا زانیاری و شارەزایی لەبارەیانەوە هەبێت، هەروەها شێوازەکانی فێرکردنیش گۆڕاون و زۆربوون لەبەر رۆشنایی ئەو پێشکەوتنە بەردەوامەی کەلەبواری پەروەردەو دەرونزانیدا ڕوو دەدەن، لەنێویشیاندا بواری ڕێگەکانی وانەوتنەوە گۆڕانی بەرچاوی بەسەرداهات.

لێهاتویەکانی وانەوتنەوەو ڕێگەکانی، بە کۆڵەگەیەکی بنەڕەتی دادەنرێت لە پرۆسەی پەروەردە وفێرکردندا کە پێویستە فێرکار زانیاری لەبارەوە هەبێت، تاکو بتوانێت لەگەڵ ژینگەی فێرکردن و فێرخوازەکاندا بەباشی کارلێك بکات.

بۆ ئەوەی فێرکار زانیاری وشارەزایی لەبارەی وانەوتنەوەو ڕێگەکانی هەبێت پێویستی بە زانیاری وشارەزاییە لەبارەی لایەنی سایکۆلۆجی فێرخواز و کەسێتی و ڕەفتاری فێرخواز , لەبەر ئەوە لەسەرەتادا بەکورتی چەند بابەتێك لەبارەی دەرونزانی گشتی دەخەینەڕوو:

## پێناسەی دەروونزانی:

زاراوەوە دەروونزانی ( Psychology ) لە ووشەیەکی یۆنانی کۆنەوە وەرگیراوە ، کە لە دوو بەش پێکهاتووە ، یەکەمیان : (سایکۆ) بەمانای دەرون ،عەقڵ یان ڕووح دێت ، دووەمیان : (لۆجی) بەمانای لێکۆڵینەوە دێت ، هەردوو کەرتەکە پێکەوە بە مانای **لێکۆڵینەوەی عەقڵ** دێت.

دەروونزانی بریتیە لە ئەو زانستەی کە لێکۆڵینەوە دەکات لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە لایەنی ژیریی و هەڵچونی و جولەیی-جەستەیی و کۆمەڵایەتییەوە .

لەڕووی چەمکەوە دەروونزانی پێکهاتووە لە دوو چەمکی لاوەکی کە ئەوانیش : زانست و دەروونن ، چەمکی زانست ئاماژەیە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی دیاردە جیاوازەکان ، بەڵام چەمکی دەروون ئاماژەیە بۆ هەڵسوکەوت و پرۆسە عەقڵیەکان ، کە هەڵسوکەوتی بینراو و هەڵچوونەکان و پرۆسە مەعریفیەکان و تایبەتمەندی جەستە دەگرێتەوە

# مێژووی سەرهەڵدانی دەروونزانی

- قۆناغی بیرە سەرەتاییەکان
- قۆناغی فەلسەفی
- قۆناغی دەرکەوتنی دەروونزانی هاوچەرخ

# قۆناغی بیره سەرەتاییەکان

- مرۆڤـ لە کۆندا دیاردە سرووشتییەکان و ڕەفتاری مرۆڤی گەڕاندووەتەوە بۆ ڕووحە نادیارەکان
- میسرییە کۆنەکان لەو باوەڕەدابوون کە بوونەوەرێکی بچووك لە جەستەی مرۆڤدایە ، ئەو بوونەوەرە بەرپرسە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی
- ڕاڤە و لێکدانەوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری بوونەوەران کراوە لەسەر بنچینەیەکی ڕووحانی

# قۆناغی فەلسەفی

١. فەیلەسوفە یۆنانییەکان

- **سۆکرات** بۆچوونی وابووە کە هەموو ڕاستییەکان لەناو خوودی مرۆڤدایە لە کاتی هەڵەکردندا مرۆڤ سزا دەدەن
- **ئەفلاتوون** : دەروونی مرۆڤی دابەش کردووە بۆ سێ بەش (دەروونی عاقڵ ، دەروونی تووڕە ، دەروونی شەهوانی )
- **ئەرستۆ** پێی وابووە ڕووح شتێکی مادی نییە ، بەڵکو کۆمەڵێك ئەرك و فرمانە کە خۆی دەبینێتەوە لە (هەستکردن و جووڵەکردن و بیرکردنەوە )

# ٢. فەلسەفەی هاوچەرخ

- **ڕینییە دیکارت ( ١٥٩٦ ـ ١٦٥٠ ز )**

بۆچوونی وابووە کە مرۆڤ گەورەی سروشتە و دەبێت عەقڵی بەکاربهێنێت و بیربکاتەوە ، ووتە بەناوبانگەکەی

**( من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم )**

- **جۆن لۆك و هارنلی و هیۆم**

گرنگترین بۆچوونەکانیان ئەوە بوو کە مرۆڤ لە دایك دەبێت مێشکی پەڕەیەکی سپییە چی ئەزموون شارەزاییەکت بوێت دەتوانیت فێری بکەیت ، جگە لەوە زانیاری هەستەکان سەرەتا ناپەیوەست و ناڕێکخراون

# قۆناغی دەرکەوتنی دەروونزانی هاوچەرخ

- سەرەتای  بە زانستیوونی دەروونزانی وەکو زانستێکی سەربەخۆ دەگەڕێتەوە بۆ سالّی (١٨٧٩ ز ) کاتێك ویلّیەم ڤۆنت یەکەم تاقیگەی لە زانکۆی لایبزگ لە ئەلّمانیا دامەزراند بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردە دەروونییەکان بەشێوەیەکی زانستی ، بەمە دەروونزانی بوو بە لقێکی سەربەخۆ لە لقەکانی زانست کە پێناسەی تایبەت بەخۆی و ئامانجی تایبەت و بواری جیاوازی تایبەت بەخۆی هەیە کە جیاوازە لە زانستەکانی تر

# دەروونزانی وەك زانستێكی پێویست:

- شارەزابوون لە مرۆڤ
- لێكۆڵینەوە بەشێوازی زانستی لە مرۆڤ
- لەسەرجەم قۆناغەكانی ژیان سودی هەیە بۆ مرۆڤ
- سەرچاوەی هەڵسوكەوتی مرۆڤ كوێیە؟
- چۆن فێری زانیاری نوێ دەبێت؟
- لایەن و پێكهێنەرەكانی رەفتار كامانەن؟رۆڵیان چیە؟

**دەروونزانی** - :

ئەو زانستەیە کە گرنگی دەدات بە تویژینەوە لە رەفتاری تاك

.

**رەفتار** - :

هەموو وەڵامدانەوەیەکە ، بۆ ورژێنەرەکان ، کە لە زیندەوەرەکانەوە دەردەکەوێت .

**ورزێنەر : -**

هەر فاکتەرێکی دەرەکیە یان ناوەکیە کە تاك یان بونەوەر چالاك دەکاتەوە ، یاخود هەموو شتێکە کە پێوویستی بە وەڵامدانەوە هەیە ،

ورزێنەر دوو جۆری هەیە : -

ورزێنەری ناوەکی کە لە ناو تاك دا درووست دەبێت ، وەك ( هەستکردن بە برسێتی ،..... هتد ) .

ورزێنەری دەرەکی کە لە دەرەوەی تاك دا روودەدات ، وەك ( دەنگ ، رۆناکی.... ) .

## وەڵامدانەوە : -

هەموو چالاکیەکە کە بەهۆی ورژێنەرێکەوە ڕوو دەدات ، و وەڵامدانەوە چەند جۆرێکی هەیە کە ئەمانەی لای خوارەوەن.

A- وەڵامدانەوەی جوڵەیی :- وەك هەڵهاتن لە شتێکی مەترسیدار .

B-وەڵامدانەوەی فسیۆلۆژی : - وەك گۆرانکاری فسیۆلۆژی ئەندامەکان

C-وەڵامدانەوەی زارەکی : - وەك وەڵامدانەوەی پرسیارێك .

D-وەڵامدانەوەی ژیری ( عەقڵی ) : - وەك بیرکردنەوە ، یادکردنەوە .

Eوەڵامدانەوەی هەڵچوونی : - وەك تورەبوون

## پێکهاتەکانی ڕەفتار

ڕەفتار لە سێ پێکهاتە یاخود بەش پێکدێت کە ئەمانەی لای خوارەوەن : -

١- پێکهاتەی مەعریفی : -

واتا ڕەفتار لە زانیارییەك یاخود زیاتر پێکدێت وەك ( بیستن ودرکپێکردنی هەواڵێکی خۆش ، یاخود ناخۆش ) .

٢- پێکهاتەی هەڵچوونی یان ویژدانی : -

واتا ئەو هەستی دڵ خۆشی و ئارامیەی کە لە بیستنی هەواڵە خۆشە کە ڕوودەدات ، یان هەستکردن بە دڵ تەنگی کە ، درووست دەبێت ، وگۆڕانکاری فسیۆلۆجی لێ درووست دەبێت . وەك ( لێدانی دڵ بە خێرایی ، سووربوونەوە )

## ٣- پێکهاتەی رەفتاری : -

وەڵامدانەوەی ورژێنەرەکانە ، بەشێوەی دەرخستنی رەفتار ، وئەم رەفتارەیش چ جوڵەیی بێت یان زارەکی بێت یان ... هتد ) . وەك ( وەستان لە ترافیك لایت ، لەکاتی بینینی لایتی سوور ، ورۆیشتن بەبینینی لایتی سەوز) .

## جۆرەکانی رەفتار

١- رەفتاری **بینراوو** : -

کەسانی دەوروبەری ئەو تاکەی کە رەفتارەکە دەنوێنێت ، دەتوانن وبەشێوەیێکی **راستەوخۆ تێبینی رەفتارەکەی بکەن** ، وەك ( نووسینەوە ، قسەکردن ، نان خواردن ..... هتد ) .

٢- رەفتاری **نەبینراوو** : -

کەسانی دەوروبەری ئەو تاکە **ناتوانن بەشێوەیێکی راستەوخۆ** رەفتارەکەی **تێبینی** بکەن ، بەڵام لە رِێگای **کاریگەریەکانیەوە** تێبینی دەکرێت ، یان لە رِێگای کەسەکە خۆیەوە ، وەك ( خەون ، یادکردنەوە ، بیرکردنەوە ) .

# ئامانجەکانی دەروونزانی

دەروونزانی هەوڵدەدات بۆ بەدیهێنانی سێ ئامانج ، ئەو ئامانجانەیش ئەمانەی لای خوارەوەن : -

١- تێگەیشتن (الفهم )

لە ڕێگای ئەم ئامانجەوە هەوڵ دەدرێت بۆ وەڵام دانەوەی دوو پرسیار ، کە یەکەمیان ( چۆن ) ؟ ودووەمیان ، ( بۆ ) ؟ ئەو ڕەفتارە ڕوودەدات یاخود ، ئەو دیاردەیە دروست دەبێت ، کە تێیدا ئەو ڕەفتارانە ڕوون دەبێتەوە.

## ٢- پێشبینی کردن (التنبؤ)

ئەم ئامانجە دەرفەتمان پێدەدات بۆ وولام دانەوەی چەند پرسیارێك، ئەویش (کەی) ؟ ئەو دیاردەیە روودەدات ؟ و( چی ) روودەدات ؟

## ٣- کۆنترۆلکردن (الضبط)

واتا توانای زالبوون وکۆنترۆل کردنی ئەو دیاردەیەی کە توێژینەوەی لەسەر کراوە لەلایەن توێژەرەکەوە .

- **لقەکانی دەروونزانی**
- لقەکانی دەروونزانی زۆرن ، وپۆلێن دەکرێن بۆ دوو بەشەوە کە تیۆری و پراکتیکی یە ، و زۆر جار ناتوانین توێژینەوەی پراکتیکیەکان لە توێژینەوەی تیۆری جیابکەینەوە ، چونکە لە پێش جێبەجێکردنی هەر توێژینەوەیکی پراکتیکی دەبێت بنەمایکی تیۆری هەبێت ، جگە لەوەی کە هەر شیتەڵکردنێك بۆ توێژینەوەیکی پراکتیکی ناکرێت ئەگەر باگراوندێکی تیۆریمان نەبێت ،( دەبێت تیۆرمان هەبێت ، تاوەکو بتوانین دەرئە نجامەکان شیتەڵبکەین.)

لقەکان دابەش دەکرێن بۆ دووبەشی سەرەکیەوە : -

١-لقە تیۆریەکان:-

کەتوێژینەوە لەسەر دیاردە دەروونیەکان دەکات و مەبەستی دۆزینەوەی تیورو دانانی بیردۆزو ، وگرنگترین ئەو لقانە ئەمانەی لەلای خوارەوەیە : -

- دەروونزانی گشتی.
- دەروونزانی جیاوازی تاکایەتی.
- دەروونزانی گەشە.
- دەروونزانی کۆمەڵایەتی.
- دەروونزانی ئاژەڵ.

## ٢- لقه **پراكتيكيەكان**:-

**تايبەتە بە پراكتيك كردنى تيور و زانست و بيردۆزەكانى دەروونزانى لەبوارە جياجياكانى ژياندا بۆ ئەوەى سوديان لىَ وربگيريَت بۆ خزمەتى مرۆڤايەتى لە گرنگترينيان:**

- دەروونزانى **پەروەردەيى**.
- دەروونزانى **پيشەسازى**.
- دەروونزانى **بازرگانى**.
- دەروونزانى **دادوەرى**.
- دەروونزانى **سەربازى** .
- دەروونزانى **كلينيكى**.
- دەروونزانى **ڕێنمايى و ئاراستەكردن**.